## پێڕست

# بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

الحمدلله ، والصلاة والسلام على رسول الله وعلى آله وصحبه ومن تبعه بإحسان الى يوم الدين ، اما بعد :

سوپاس و ستایش بۆ پەروەردگاری جیهانیان کە ئێمەی بە شایستەزانی بۆ نووسینی ئەم کتێبە و یارمەتی داین بۆ نوسینی ئەم کتێبە ، بەوهیوایەی کە ببێتە هۆکاری سوود بۆئەو مسوڵمانانی کە تاکوو ئێستا بەهەر هۆکارێک نەیانتوانیوە کە ئەم زانستە پیرۆزە بخوێنن ، وە بۆ ئەو کەسانەشی دەیانەوێ زیاتر زانیاری لەسەر ئەم زانستە پیرۆزە بزانن .

بێگومان فێربوونی ئەم زانستە کارێکی گرنگ و پێویستە ، چونکە لە یەکێک لە ئەدەبەکان لەگەڵ قورئان ئەوەیە کە بەو شێوەیە بیخوێنینەوە کە بۆ سەر پێغەمبەر ﷺ دابەزیووە ، وەک پەروەردگار دەفەرمووێ :

{ وَرَتِّلِ الْقُرْآنَ تَرْتِيلاً } ( سورەتی المزمل ٤ ) واتە : { دەوری قورئان بکەوە بە لەسەر خۆیی واتا بەرێک و پێکی }

بێگومانیشە کە خوێندنی ئەم زانستە پیرۆزە پێویستی بە هەوڵ و کۆشش هەیە لەلایەن فێرخوازەوە ، بەڵام هەڵبەتە کارێکی قورس نیە چونکە پەروەردگار دەفەرمووێ :

{ وَلَقَدْ يَسَرنا الْقُرءَانَ لِلذِّكرِ فَهَلْ مَن مُّدَّكَر } ( سورەتی القمر ١٧ ، ٢٢ ، ٣٢ ، ٤٠ )

{ واتە : سوێند بە خودا بەڕستی ئێمە قورئانمان ئاسانکردوە بۆ ئامۆژگاری لێوەرگرتن جـا ئـایە پەمەند وەرگرێک هەیە؟ }

وە پێغەمبەریش ﷺ دەربارەی فێربوونی قورئان دەفەرمووێ : { خَيْرُكُم مَن تَعَلَّمَ الْقُرآنَ وَعَلَّمَهُ } ( صحيح البخاري ٥٠٢٧ )

واتە : { باشترینتان ئەوانەن کە خۆی فێری قورئان دەکات و خەڵکانی تریش فێردەکات }

ئێمەش لەژێر ڕۆشنایی ئەم ئایەت و فەرموودانەدا هەوڵمانداوە بە ئاسانترین شێوە یارمەتی فێرخوازان بدەین تاکوو لەم زانستە زیاتر شارەزابن و لێی تێبگەن و ئەوانیش کەسانی تر شارەزابکەن لەم زانستە .

وە إن شاءاللَّه ئەم کتێبە دەبێتە ڕێنموونێکی باش بۆ فێرخوازان ، و داواکارین لە پەروەردگار کە ئاسانی بکات لەسەرمان

داواکارین لە پەروەردگار کە لەتەواوی کەموکورتییەکمان ببورێت ، چونکە بەڕاستی هەر ئەو میهرەبانترین و بەبەزەیی ترینە .

والحمدلله رب العالمين

# سەرەتایەک

ئەو نیشانە و هێمایانەی قوتابی پێویستە بیانزانێت :

سکون : هێماکەی بریتییەلە ( -ْ ) بازنەیەکە بچووک لەسەر پیتەکە .

ئەم نیشانەیە هیچ لە پیتەکە ناگۆڕێت ، بەڵکو پیتەکە وەکخۆی دەمێنێتەوە .

نموونە : ( بْ = باء ) ( مْ = میم ) ( سْ = سین )

فەتحە : هێماکەی بریتییە لە ( -َ ) خەتێکی بچووکە لەسەر پیتەکە .

ئەم نیشانەیە بزوێنێکی کورت بۆ خوێندنەوەی وشەکە زیاد دەکات .

نموونە : ( کَ = کە ) ( تَ = تە ) ( رَ = رە )

زەمە : هێماکەی بریتییە لە ( -ُ ) واوێکی بچووکە لەسەر پیتەکە .

ئەم نیشانەیە واوێکی بچووک بۆ خوێندنەوەکە زیاد دەکات .

نموونە : ( سُ = سو ) ( دُ = دو ) ( حُ = حو )

کەسرە : هێماکەی بریتییە لە ( -ِ ) خەتێکی بچووکە لەژێر نیشانەکە .

ئەم نیشانەیە یائێکی بچووک بۆ خوێندنەوەی وشەکە زیاد دەکات .

نموونە : ( مِ = می ) ( تِ = تی ) ( قِ = قی )

تەنوین : سێ جۆرە :

١ – تەنوینی کەسرە : هێماکەی بریتییە لە ( -ٍ ) کە دوو فەتحەن بە ژێریەکەوە .

ئەم نیشانەیە یائێک و نونێک بۆ خوێندنەوەی پیتەکە زیاد دەکات .

نموونە : ( مٍ = مین ) ( کٍ = کین ) ( دٍ = دین )

٢ – تەنوینی فەتحە : هێماکەی بریتییە لە ( -ً ) دوو فەتحە بەسەریەکەوە .

ئەم نیشانەیە بزوێنێکی کورت و نونێک بۆ خوێندنەوەی وشەکە زیاد دەکات .

نموونە : ( سً = سەن ) ( قً = قەن ) ( تً = تەن )

٣ – تەنوینی زەممە : هێماکەی بریتییە لە ( -ٌ ) یاخود ( -ُ ) کە دوو زەممەیە بەیەکەوە .

ئەم نیشانەیە واو و نونێک بۆ وشەکە زیاد دەکات .

نموونە : ( تٌ = تون ) ( حٌ = حون ) ( دٌ = دون )

شەددە : هێماکەی بریتییە لە ( -ّ ) کە نیشانەکەی وەکوو پیتی W ی ئینگلیزییە .

ئەم نیشانەیە واتا : لە بنەڕەتدا وشەکە دوو پیتە بەڵام کورتکراونەتەوە و هێمای شەددە بۆ سەر پیتەکە زیاد کراوە ، وە لەکاتی خوێندنەوەشدا قورستر دەردەبڕێ وەک لە وشەکانی تر .

نموونە : ( تّ = تت ) ( فّ = فف ) ( دّ = دد )

جیاوازی نێوان ( کەسرە ) لەگەڵ ( یاء ) :

لەکاتی خوێندنەوەدا ( کەسرە ) کەمتر درێژدەکرێتەوە وەک لە ( یاء ) ، واتە : ئەگەر ( یاء ) دوو حەرەکە درێژبکرێتەوە ، ئەوە ( کەسرە ) یەک حەرەکە درێژدەکرێتەوە .

جیاوازی نێوان ( زەممە ) لەگەڵ ( واو ) :

لەکاتی خوێندنەوەدا ( زەممە ) کەمتر درێژدەکرێتەوە وەک لە ( واو ) ، واتە : ئەگەر ( واو ) دوو حەرەکە درێژبکرێتەوە ، ئەوە ( زەممە ) یەک حەرەکە درێژدەکرێتەوە .

جووڵە ( حەرەکە ) چیە ؟

وەڵام : واتا درێژکردنەوەی وشەکە لەکاتی خوێندنەوەی وشەکە .

چۆن ژمارەی جووڵە ( حەرەکەکان ) هەژمار بکەم ؟

وەڵام : بۆ نموونە ئەگەر ویستت دوو جوڵە درێژ بکەیتەوە ئەوا پشت بە ژماردنی درێژکردنەوەکە ببەستە ، بەجۆرێک ئەگەر ویستت دوو جووڵە درێژ بکەیتەوە ؛ ئەوە لە کاتی درێژکردنەوەدا بە ئەندازەی ژماردنی ژمارە ( یەک ، دوو ) بە شێوەی ژماردنێکی ئاسایی درێژی بکەوە ، وە ئەگەر ویستت ( شەش ) جووڵە درێژی بکەیتەوە ، ئەوە بە ئەندازەی ژماردنی ژمارە ( یەک تاکوو شەش ) بەشێوەی ژماردنێکی ئاسایی درێژی بکەوە ، بۆ ئەوانی تریش بەهەمان شێوە .



# ( احكام النون الساكنة والتّنوين )

## یاساکانی نونی ساکین و تەنوین

نونی ساکین چیە ؟

وەڵام : ئەو نونەیە کە هیچ یەکێک لە هێماکانی ( فەتحە ، زەممە ، کەسرە ) ی لەسەر یان لەژێرنیە ، بەڵکو هێمای سکونی لەسەرە .

دوو خاڵی گرنگ :

١ – لە یاسای نونی ساکیندا تەنها کار لەسەر پیتی ( ن ) دەکەین ، بەڵام بەو مەرجەی وەک وتمان دەبێ ساکین بێت .

وەک : منْ | عنْ

٢ – هەر لێرەشدا کار لەسەر تەنوینەکان دەکەین ، چونکە تەنوینەکان وەک باسمان کرد ( نونیان لەگەڵە ) لەکاتی خوێندنەوە .

وەک : منً ( مەن ) منٍ ( مین ) منٌ ( مون )

# یاساکانی نونی ساکین لەگەڵ پیتەکانی زمانی عەرەبی

**١ – اظهار ( دەرخستن )** : لەم یاسایەدا نونی ساکن ( نْ ) و تەنوینەکان زۆر بەجوانی دەردەخەین و دەیخوێنینەوە وەکخۆی ، بەڵام بەومەرجەی نونی ساکن ( نْ ) لەگەڵ یەکێک لەم شەش پیتانەدا بێت : ( ع ، غ ، ح ، خ ، هـ ، ء )

یاسا :

نونی ساکن ( نْ ) + { ع ، غ ، ح ، خ ، هـ ، ء } = اظهار ( دەرخستن )

نموونە بۆ پیتی ( ع ) : مِنْ عَلَق ( مین عەلەق ) | حَكِيمٌ عَلِيم ( حەكیمون عەلیم )

نموونە بۆ پیتی ( ح ) : مِنْ حَيثُ ( مین حەیثو ) | حَكِيمٍ حَمِيد ( حەكیمین حەمید )

نموونە بۆ پیتی ( غ ) : مِنْ غِلّ ( مین غیلل ) | أَجْرٌ غَيرُ ( ئەجرون غەیر )

نموونە بۆ پیتی ( خ ) : وَالْمُنْخَنِقة ( وەلمونخەنیقە ) | قِرَدَةً خَاسِئِين ( قیرەدەتەن خاسیئین )

نموونە بۆ پیتی ( هـ ) : وَلِكُلِّ قَوْمٍ هَاد ( وەلیكوللی قەومین هاد ) | يَنْهَونَ ( یەنهەونە )

نموونە بۆ پیتی ( ء ) : مَنْ ءَامَنَتْ ( مەن ئامەنەت ) | عَذَابٌ أَلِيم ( عەذابون ئەلیم )

ڕەنگی سوور ئاماژەیە بۆ نونی ساكین

ڕەنگی شین ئاماژەیە بۆ گەیشتنی نونی ساکین بە حەوت پیتەکەی تێکهەڵکێشان

لە دەرخستن ( اظهار ) بۆ ئەوەی نونەکە بەجوانی دەرکەوێ ئەوە بەشی پێشەوەی زمانت بلکێنە بە مەڵاشو

دەرخستن ( اظهار ) لە یەک وشە و دوو وشەشدا دەکرێت ڕووبدات ، نموونە :

مِنْ عَلَق ( مین عەلەق ) ( نموونە بۆ دوو وشە )

وَالْمُنْخَنِقة ( وەلمونخەنیقە ) ( نموونە بۆ یەک وشە )

٢ – تێکهەڵکێشان ( ادغام ) : لەم یاسایەدا هەریەکێک لەم شەش پیتانە ( ي ، ر ، م ، ل ، و ، ن ) کە بۆ ئاسان لەبەرکردن کورتکراونەتەوە لە وشەی ( یرملون ) هەرکاتێک ( نونی ساکین یان هەریەکێک لە تەنوینەکان ) لەکۆتایی وشەیەک بوو و پیتەکانی ( یرملون ) یش لە سەرەتای وشەی دوای خۆی بوو ؛ ئەوا ئەوکات ( نونە ساکینەکە ) لادەبەین و ئەو پیتانەی ( یرملون ) کە لەدوای خۆی دێت ؛ دەبێت بە شەددە ( -ّ ) واتا بە توندی دەیخوێنینەوە .

تێبینی : بۆ تەنوینەکان وەک پێشتر باسمان کرد تەنوینەکان بەمجۆرەن :

١ – ( -ً ) ( تەنوینی فەتحە ) = ن

٢ – ( -ٍ ) ( تەنوینی کەسرە ) = ین

٣ – ( -ٌ ) ( تەنوینی زەممە ) = ون

لەکاتی بوونی تەنوین و دوای خۆیشی پیتەکانی ( یرملون ) هات ئەوا کار لەسەر ( نونی تەنوینەکە دەکەین )

یاسا :

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| نْ ، ـً ، ـٍ ، ـٌ | + | ی ، ر ، م ، ل ، و ، ن | = | تێکهەڵکێشان ( ادغام ) |

تێبینی ١ : ئاگەداری ئەو مەرجەبە کە دەبێت نونەکە ساکین بێت و پیتی دوای نونەکە کە ( یرملون ) ــە مەرجە دەبێت جوڵاوبێت  واتا ( فەتحە یان کەسرە یان زەممە ) ی لەسەربێت .

تێبینی ٢ : تێکهەڵکێشان ( ادغام ) دەکرێت بە دوو بەش :

یەکەم : ادغام بغنة ( تێکهەڵکێشان بە مینگە )

دووەم : ادغام بغیر غنة ( تێکهەڵکێشان بەبێ مینگە )

تێبینی ٣ : ( غنة – مینگە ) بریتییە لە درێژکردنەوەیەکی کەم کە یەکسانە بە دوو جوڵە درێژکردنەوە .

**جۆری یەکەم : تێکهەڵکێشانی بە مینگە ( ادغام بغنة ) :**

ئەو تێکهەڵکێشانەیە کە ( نْ ) نونی ساکیم دەگات بە چوار لە پیتەکانی ( یرملون ) ئەو چوار پیتەش بریتین لە :

**( ي ، ن ، م ، و )** کە کۆکراونەتەوە لە وشەی **( ینمو )** دا .

لەو کاتەدا ئێمە ( نونە ساکینەکە ( نْ ) ) لادەبەین و پیتەکانی ( ینمو ) کە بە جوڵاوی لەدوایەوە دێت مینگەی پێدەدەین .

واتا دوو جوڵە درێژی دەکەینەوە ، بەڵام وریابە ئەو چوار پیتە شەددە ( -ّ ) وەرناگرن ، بەڵکو تەنیا دوو جوڵە درێژی دەکەینەوە ،

نموونە بۆ پیتی ( ي ) :

لِقَومٍ یُؤمِنُون ← دەبێتە ← لِقَومِ یُؤمنُون

لیقەومین یوئمینون ← لیقەومی یوئمینون

نموونە بۆ پیتی ( ن ) :

إِنْ نَقُول      دەبێتە      إِنَّقُول  ( نونەکە دوو جووڵە درێژ دەکرێتەوە )

ئین نەقول      ئینەقول

نموونە بۆ پیتی ( م ) :

مِنْ مَسَد      دەبێتە      مِمَّسَد  ( میم ی دووەم دوو جووڵە درێژ دەکرێتەوە )

مین مەسەد      میمەسەد

نموونە بۆ پیتی ( و ) :

سِرَاجَاً وَهَّاجاً      دەبێتە      سِرَاجَاَ وَهَّاجاً  ( واو ەکە دوو جووڵە درێژ دەکرێتەوە )

سیراجەن وەهاجا      سیراجەوەهاجا

تێبینی : پیتەکانی ( ن ، م ) جوانتر مینگەیان بۆدەکەین لەچاو دوو پیتەکانی تر .

**جۆری دووەم : تێکهەڵکێشانی بەبێ مینگە ( ادغام بغیر غنة ) :**

ئەو تێکهەڵکێشانەیە کاتێتێک نونی ساکین ( نْ ) دەگات بە دوو لە پیتەکانی ( یرملون ) ، ئەوانیش : ( ل ، ر ) لەوکاتەدا ( نْ ) نونەساکینەکە لادەبەین و پیتەکانی ( ل ، ر ) کە بە جوڵاوی بەدوایدا دێت ( شەددە –ّ ) وەردەگرن .

نموونە بۆ پیتی ( ل ) :

أَنْ لَو ← دەبێتە ← أَلَّو

ئەن لەو ئەللەو

نموونە بۆ پیتی ( ر ) :

مِنْ رَبِّك ← دەبێتە ← مِرَّبِك

مین رەبیک میررەبیک

لێرەدا پیتەکانی ( ل ، ر ) شەددە وەردەگرن بۆیە توندیان دەکەین و کەمێک بە قورسی دەیانلێینەوە .

تێبینی : تێکهەڵکێشان هەرگیز لە ( یەک ) وشەدا ڕونادات ، بەڵکوو دەبێت دوو وشەی جیابێت :

نموونە : صِنْوَان ، بُنْيَان ، قِنْوَان ( وشەکان ناگۆڕین چوونکە یەک وشەن و تێکهەڵکێشان ڕوونادات )

**٣ – گۆڕین ( اقلاب ) :**

وەک لە ناواکەیدا دیارە لەم یاسایەدا ( نونی ساکین و تەنوینەکان ) دەگۆڕین .

دەیگۆڕین بەچی ؟

وەڵام : دەیگۆڕین بۆ پیتی ( م ) بەڵام میمێکی شاراوە و دوو جووڵـەش درێژی دەکەینەوە .

کەی دەیگۆڕین ؟

وەڵام : کاتێک ( نونی ساکینەکە یان تەنوینەکان ) دەگەن بە پیتی ( ب ) ئەوا ئەوکاتە ( نونە ساکینەکە یان تەنوینەکان ) دەگۆڕێن بۆ پیتی ( م )

یاسا :

نْ

ـً

+ پیتی ( ب ) = گۆڕین ( اقلاب )

ـٍ ( جولاو )

ـٌ

شاردنەوە چیە ؟

وەڵام : واتا بەتەواوی پیتەکە دەرنەخەی ، ئێمەش لێرەدا پیتی ( م ) دەشارینەوە ، و بۆ شاردنەوەشی لەکاتی وتنی پیتەکەدا هەردوو لێوت نابەیتە سەر یەک ، واتا بەتەواوی دایناخەین بەڵکوو بۆشاییەکی کەم دەهێڵینەوە لەنێوان لێوەکان .

نموونە :

لَيُنْبَذَنَّ دەبێتە لَيُمْبَذَنَّ

لەیونبەذەننە لەیومبەذەننە

أَنْبِئُونِي دەبێتە أَمْبِئُونِي

ئەنبیئونی ئەمبیئونی

عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُر دەبێتە عَلِيمُمْ بِذَاتِ الصُّدُر

عەلیمون بیذاتیصصودور عەلیموم بیذاتیصصودور

لێرەدا ئەو پیتە میمەی کە درووستمان کردووە لەگەڵ شاردنەوەشی ، دوو جووڵە درێژی دەکەینەوە .

دوو تێبینی گرنگ :

١ – پیتی ( ب ) بەهیچ شێوەیەک مینگە و درێژکردنەوە وەرناگرێ  بەڵکو وەکخۆی دەمێنێتەوە .

٢ – لە قورئاندا بۆ ئاسانکاری و ناسینەوەی ( اقلاب ) میمێکی بچووک لەسەر نونی ساکینەکە کراوە و نوسراوە : ( نۢ )

**٤ – شاردنەوە ( اخفاء ) :**

لەم یاسایەدا ئێمە نونی ساکین و تەنوینەکان دەشارینەوە لە خوێندنەوەدا .

شاردنەوە بەمانای ئەوە نایەت کە نونی ساکین و تەنوینەکان لابەین ، بەڵکو کەمێک دەیانشارینەوە لەکاتی خوێندنەوە ، بەواتایەکی تر : نەوەکوو ئاشکراکردن ( اظهار ) ئاشکرای دەکەین ، وە نە وەکوو تێکهەڵکێشان ( ادغام ) لایدەبەین ، بەڵکو لەنێوان هەردووکیان دایە .

شاردنەوەی نونی ساکین : لەکاتی دەربڕینی پیتی نونی ساکین زمانت لەنێوان مەلاشوو و ژێر زمانت بهێڵەوە .

واتا بەر سەر و خواری زمان نەکەوێت ، بەڵکو لەنێوان هەردووکیان ڕایگرە و درێژی بکەوە .

کەی شاردنەوە ڕوودەدات ؟

وەڵام : کاتێک نونی ساکین بگات بە ( ١٥ ) پیتەکانی : ( د ، ذ ، ز ، س ، ش ، ص ، ض ، ط ، ظ ، ف ، ق ، ك ، ت ، ث ، ج )

بەڵام بۆ ئاسان لەبەر کردنی پیتەکان تۆ تەنیا پیتەکانی ( اظهار و اقلاب و ادغام ) لابدە ئەوە یەکسانە پیتەکانی ( اخفاء )

بە واتایەکی تر : کە گەشتیت بە هەرپیتێک لە نونی ساکین ئەگەر یەکێک نەبوو لە پیتەکانی (اظهار و اقلاب و ادغام ) ئەوە پیتی ( اخفاء ) ـــــە .

یاسا :

نْ

ً

+ ١٥ پیتەکان = شاردنەوە ( اخفاء )

ٍ

ٌ

نموونە :

وَكَأْساً دِهَاقاً ( وە کەئسەن دیهاقا ) ( ئەم تەنوینە دەشارینەوە وەک ئاماژەمان پێدا )

يَنْكُثُون ( یەنکوثون ) ( ئەم نونە ساکینە دەشارینەوە وەک ئاماژەمان پێدا )

چەند تێبینییەکی گرنگ :

١ – لە شاردنەوەدا نابێت مینگەکە بگوازریتەوە بۆ پیتەکانی دوای خۆی ، واتا مینگە تەنیا لەسەر نونی ساکین دەکرێ نەوەک پیتی تر ، بەڵکوو پیتەکانی تر وەکخۆیان دەخوێندرێنەوە .

٢ – لە شاردنەوەدا کاتێک نونی ساکین دەگات بە پیتەکانی ( ك ، ق ) ، ئەوە لەکاتی خوێندنەوەی نونی ساکینەکە بەشی پشتەوەی زمانت بلکێنە بە مەڵاشووت .

٣ – شاردنەوە کەمێک قەڵەو دەکەین و نونە ساکینەکە بە شاراوەیی و قەڵەوی دەخوێنینەوە ئەگەر گەیشت بەم پیتانە ( ص ، ض ، ط ، ظ ) چونکە خۆیان پیتی قەڵەون و دەبێ بە قەڵەوی بخوێندرێنەوە .

# احكام الميم السّاكنة

# یاساکانی میمی ساکین

**میمی ساکین** : ئەو میمەیە کە هیچ یەکێک لە هێماکانی ( کەسرە ، زەممە ، فەتحە ، تەنوین ) ی لەسەر یان لەژێر نیە .

لەم یاسایانەدا کار لەسەر ( پیتی میم ) دەکەین .

میمی ساکین لەگەڵ پیتەکانی زمانی عەرەبیدا دەکرێت بە سێ یاسا :

**١ – شاردنەوە بە لێو ( اخفاء الشّفوي ) :**

ئێمە پێشتر زانیمان کە شاردنەوە لەنێوان ( ادغام ) و ( اظهار ) دایە ، واتە کەسێک بە ناڕونی دەیخوێنێتەوە و لەکاتی خوێندنەوەدا مینگەی پێدەکات و دوو جوڵە درێژی دەکاتەوە .

کەی میمی ساکین دەشاردرێتەوە ؟

وەڵام : کاتێک میمی ساکین ( مْ ) گەیشت بە ( ب ) ی جوڵاو ، ئەوە ئەوکاتە میمە ساکینەکە بە مینگە و بە ئەندازەی دوو جووڵە درێژی دەکەینەوە .

یاسا :

مْ + ب ( جولّاو ) = شاردنەوەی لێوی ( اخفاء الشّفوي )

نموونە :

يَعْتَصِمْ بِاللَّه ( یەعتەصیم بیللاهـ ) ( خوێندنەوەی ئەم میمە بە مینگە )

تێبینی : لەکاتی خوێندنەوەی ( میم ) بە مینگە ، نابێت مینگەکە بچێت بۆ پیتی ( ب ) چونکە دەبێت حەرەکەی سەر پیتی ( ب ) وەکخۆی بخوێندرێتەوە

## ٢ – تێکهەڵکێشان بە لێو ( ادغام الشّفوي ) :

لەم یاسایەدا میمی ساکین ( مْ ) لادەبەین ، کاتێک گەیشت بە میمێکی تری جولّاو ( متحرك ) لەدوای خۆی .

ئەوکاتە ئێمە میمی یەکەم کە میمە ساکینەکەیە ( مْ ) لادەبەین و میمی دووەم کە جووڵاوە ( مُ ، مِ ، مَ ) شەددە ( ّ ) ی بۆ زیاد دەکەین و بە ئەندازەی دوو جووڵە درێژی دەکەینەوە .

یاسا :

مْ + مُ / مِ / مَ = تێکهەڵکێشان بە لێو ( ادغام الشفوي )

نموونە :

لَهُمْ مَايَشَاءُون ← دەبێتە ← لَهُمَّايَشَاءُون

لەهوم مایەشائون ← لەهوممایەشائون

هُمْ مِنْهَا ← دەبێتە ← هُمِّنْها

هوم مینها ← هوممینها

### ٣ – دەرخستن بە لێو ( اظهار الشّفوي ) :

لەم یاسایەدا ئێمە میمی ساکین ( مْ ) وەکخۆی دەخوێنینەوە .

کاتێک گەیشت بە هەرپیتێکی تر جگە لە پیتەکانی ( م ) و ( ب ) ، چونکە لە ئەگەری گەیشتن بەم دووانە ئەوە دەبێت بە یەکێک لە دوو جۆرەکەی سەرەتای یاساکانی میمی ساکین باسمان کرد .

یاسا :

مْ + هەرپیتێک جگە لە ( م ، ب ) = دەرخستن بە لێو ( اظهار الشّفوي )

نموونە :

أَلحَمْدُللَّه ( ئەلحەمدولیللاهـ )

# انواع من الادغام

# جۆرەکانی تێکهەڵکێشان

تێکهەڵکێشان باسمان کردووە کە بریتییە لە ( لابردن ) ، لە تێکهەڵکێشاندا پیتی یەکەم کە ساکین ــە لایدەبەین و پیتی دواى خۆی کە ( جولاوە ) ( شەددە ـّ ) وەردەگرێ .

لە کتێبە تەجویدییەکاندا نوسراوە کە : لە تێکهەڵکێشاندا دوو پیتەکە لە یەک هەڵدەکێشرێن و بەیەکەوە پیتێکی شەددەدار ( ـّ ) درووست دەکەن ، بەڵام بۆ ئاسان لەبەرکردن و تێگەیشتن تۆ ئەوەی سەرەوە بزانە بەستە .

سێ جۆر تێکهەڵکێشانمان هەیە :

جۆری یەکەمی تێکهەڵکێشان : تێکهەڵکێشانی هاوشێوە ( المتماثلين ) :

ئەم جۆرە بریتییە لەوەی کە دوو پیت بەدوای یەکدا دێن و وەک یەکن واتە هاوشێوەن ، بەڵام بەمەرجێک دەبێت یەکەمیان ساکین بێت و دووەمیان جولاو بێت ، وەک ( فْ + فَ = فَّ ) ، ئەوکاتە ئێمە پیتە ساکینەکە لادەبەین و پیتە جولاوەکە شەددە وەردەگرێت .

نموونە : ( بْ + ب ( جولاو ) ) :

اضْرِبْ بِعَصَاكَ ← دەبێتە اضْرِبِّعَصَاكَ

ئیضریب بیعەصاک ← ئیضریببیعەصاک

نموونە : ( كْ + ك ( جولاو ) ) :

يُدْرِكْكُم ← دەبێتە يُدْرِكُّم

یودریک کوم ← یودریککوم

نموونە : ذْ + ذ ( جولاو ) ) :

اذْ ذَهَب دەبێتە اذَّهَب

ئیذ ذەهەب ئیذذەهەب

لێرەدا ئەو پیتانەی بە ڕەنگی شین نوسراون کە پیتی دووەمن ، دەبێ شەددەیان پێ بدەی و بە ئەندازەیە دوو جوڵە درێژیان بکەیەوە .

تێبینی گرنگ :

١ – لە تێکهەڵکێشاندا لە پیتەکانی ( مْ + م ( جولاو ) ) و ( نْ + ن ( جولاو ) ) دا دەبێت توونکردنەکەت جوانتر بێت و مینگەشی لەگەڵبێت واتە : بە لوتیشدا تێبپەڕن جگە لەوەی دەبێ شەددە وەرگرن .

٢ – ئەگەر ئەوپیتانەی بەدوای یەکدادێن یەکەمیان جولاو بێت و دووەمیان ساکین بێت ( پێچەوانەی یاساکە ) ئەوە تێکهەڵکێشان ڕونادات .

نموونە : يُمْدِدْكُم ( يومديدكوم ) ( یاسا وەرناگرێت )

٣ – هەرکاتێک پیتەکانی ( وْ + و ( جولاو ) ) یان ( يْ + ي ( جولاو ) ) گەیشتن بەیەک ، تێکهەڵکێش ناکرێن چونکە ئەوانە پیتی ( مەد – درێژکردنەوە ) ــن و ان شاءالله لە جێگای خۆی باسی دەکەین ، بەڵام یەک وشەی شاز هەیە کە سێ جار دووبارە بۆتەوە لە قورئاندا لە سورەتەکانی ( البقرة ) و ( آل عمران ) و ( المائدة ) دایە کە بە شەددە واوەکە دەخوێندرێتەوە بەڵام توندی مەکە ( لەنێوان شەددە و واوێکی ئاسایی بیخوێنەوە ) ئەویش :

عَصَوْا وَكَانُوا دەبێتە عَصَوَّكَانُوا

عەصەو وەکانو عەصەووەکانو

ئەمەش بۆیە ڕویداوە چونکە لەپێش واوە ساکینەکە فەتحە هەیە .

جۆری دووەمی تێکهەڵکێشان : هاوڕەگەز ( المتجانبين ) :

لەم جۆرە تێکهەڵکێشانەدا ئەگەر پیتی ( ساکین ) گەیشت بە پیتێکی جوڵاو ، بەڵام پیتە جوڵاوەکە لەخۆی نەبێت ، واتە هەمان پیت نەبن ، بەڵکو ( شوێنی دەرچونیان یەک بێت ) واتە هەردوو پیتەکە لەهەمان شوێنی قورگ یان دەم دەردەچن ، بەڵام لە خوێندنەوەدا لەیەک ناچن ، وەک ( ط ) و ( ت ) کە لە قورگ و دەم لەیەک جێگا دەردەچن ، بەڵام لەخوێندنەوەدا وەک یەک نین .

ئەوکاتە ئێمە پیتە ساکینەکە لادەبەین و شەددە دەدەینە پیتە جوڵاوەکە ، بەڵام ئاگەداربە مەرجە یەکەم ساکین بێت و دووەم جوڵاو.

پێویستە لەم بابەتەدا پیتەکان و شێوازی ڕیزبوونی پیتەکان لەبەر بکەیت ئەگینا توشی هەڵە دەبیت .

نموونەکان :

١-تْ + ط ( جوڵاو ) :

وَدَتْ طَائِفَة ← دەبێتە وَدَطَّائِفَة

وەدەت طائیفە ← وەدەططائیفە

٢-طْ + ت ( جوڵاو ) :

بَسَطْتَ ← دەبێتە بَسَتَّ

بەسەطتە ← بەسەتتە

٣-تْ + د ( جوڵاو ) :

أَثْقَلَتْ دَعَوَا ← دەبێتە أَثْقَلَدَّعَوَا

ئەثقەلەت دەعەو ← ئەثقەلەددەعەو

٤-دْ + ت ( جولاْو ) :

قَدْ تَبَيَّنَ ← دەبێتە ← قَتَّبَيَّنَ

قەد تەبەییەنە ← قەتتەبەییەنە

٥-ذْ + ظ ( جولاْو ) :

إِذْ ظَلَمُوا ← دەبێتە ← إِظَّلَمُوا

ئیذ ظەلەموو ← ئیظظەلەموو

٦-ثْ + ذ ( جولاْو ) :

يَلْهَثْ ذَٰلِكَ ← دەبێتە ← يَلْهَذَّٰلِكَ

یەلهەث ذالیک ← یەلهەذذالیکە

٧-بْ + م ( جولاْو ) :

إِرْكَبْ مَعَنَا ← دەبێتە ← إِرْكَمَّعَنَا

ئیرکەب مەعەنا ← ئیرکەممەعەنا

تێبینی گرنگ :

١ – زۆر ئاگەداری ڕیزبەندی پیتەکان ببە ، واتە چۆن پیتەکان ڕیزکراون و کام پیت لەگەڵ کام پیت هاتووە ، چونکە هەر ئەو حەوت جۆرەن کە باسمان کردوون و لەوانە تێپەڕ ناکات .

٢ – ئەگەر پیتی ( طْ ) گەیشت بە پیتی ( ت ) ی جولاْو ئەوا ( طْ ) ـەکە قەڵەوییەکەی لەدەست نادات ، واتە ئەو ( ت ) جولاْوەکە سەرەڕای ئەوەی کە ( تائێکی ) ناسکە ، بەڵام کەمێک بە قەڵەوی بیخوێنەوە ، چونکە پیتی ( ط ) لەپێش بووە ، ئەم تێبینییەش تەنها بۆ خاڵی دووەمی نموونەکان ڕاستە .

٣ – ئەم یاسایانە باسکراون جێبەجێ ناکرێن ئەگەر پیتی یەکەم جولاّوبێت و پیتی دووەم ساکین بێت ( پێچەوانەی یاسا ) ئەوکات هەر پیتێک بە جولّەی خۆی دەخوێندرێتەوە .

جۆری سێیەمی تێکهەڵکێشان : لەیەک نزیک ( المتقاربين ) :

ئەمەیان کاتێک ڕودەدات کە ئەو دوو پیتەی بەدوای یەکدادێن لەخوێندنەوەدا لەیەک نزیکن ، وەک ( ل ) لەگەڵ ( ر ) یان ( ق ) لەگەڵ ( ک ) .

کە ئەم پیتانە لە خوێندنەوەدا لەیەک جیاوازن ، بەڵام لە شێوازی خوێندنەوەکەیاندا کەمێک لەیەک دەچن و لەیەک نزیکن.

مەرجە بۆ ئەم بابەتە پیتی یەکەم ساکین بێت و دووەمیش جولاّو بێت .

لێرەدا پیتی یەکەم کە ساکینە لادەبەین و پیتی دووەم کە جولاّوە شەددەی بۆ دادەنێین .

نموونە :

١ – لْ + ر ( جولاّو ) :

بَلْ رَبُّكُمْ دەبێتە بَرَّبُّكُمْ

بەل ڕەببوکوم بەڕڕەبوکوم

٢ – قْ + ک ( جولاّو ) :

نَخْلُقْكُم دەبێتە نَخْلُكُّم

نەخلوقکوم نەخلوککوم

تێبینی : ئەم دوو یاسایە بە هەڵگەراوەیی ( عەکسەوە ) هەڵەیە .

تێبینی :

١ – لەم جۆرەی تێکهەڵکێشاندا کە لەیەک نزیکن ، ئاگاداری پیتەکان ببە ، بزانە کام پیت لەگەڵ کام پیت هاتووە ، چونکە پێچەوانەی بکەیەوە هەڵە دەبێت .

لْ + ر ( جوڵاو )          ( یاسای دروست )

رْ + ل ( جوڵاو )          ( یاسای هەڵە )

٢ – لە تێکهەڵکێشانی ( قْ + ک ( جوڵاو ) ) دا قەڵەوی ( ق ) لە ( ک ) دا دەمێنێتەوە ، واتە کەمێک پیتی ( ک ) بە قەڵەوی و بە شەددەوە بخوێنەوە .

# احكام اللام

# یاساکانی لام

پیتی ( ل ) لە قورئاندا دوو ئەگەری هەیە ، ئەوانیش :

ئایە لامەکە دەخوێندرێتەوە ، یان ناخوێندرێتەوە ؟

ئەگەر لامەکە نەخوێندرایەوە ئەوا لامەکە شەمسییە ، بەڵام ئەگەر خوێندرایەوە ئەوا لامەکە قەمەرییە .

پیتە شەمسی و قەمەرییەکانمان هەیە تا لەبەریان بکەین ، بەڵام ئێمە پیتەکان لەبەر ناکەین و یاسایەکی ئاسانترمان هەیە . چۆن؟

وەڵام : هەرکاتێک لەسەرەتای وشەدا ( ل ) هەبوو وە لامەکە ( سکون ) ی لەسەر بوو ( لْ ) ئەوا تۆ بڵێ : دەخوێندرێتەوە .

وە ئەگەر لامەکە هیچی لەسەر نەنوسرابوو ( ل ) ، ئەوا بڵێ : ناخوێندرێتەوە .

هەرکات لامەکە لەهەر جێگایەک و هەر لامێک بێت ، سکونی لەسەر نوسرابێت دەخوێندرێتەوە ، وئەگەر لەسەری نەنوسرابێت ناخوێندرێتەوە جا لەهەر شوێنێک بێت و هەر لامێک بێت .

تێبینی : لەم بابەتەدا تەنها کار لەسەر ( لامی ساکین ) دەکەین .

تێبینی : پیتی ( ل ) ئەگەر هێمای سکونی لەسەر بێت یان هیچی لەسەر نەبێت ، لامەکە هەر سکون حسابە، بەڵام ئەگەر لامەکە جوڵاو بوو ، بوجوڵەکەی خۆی وەکخۆی دەخوێنینەوە ، وەک : ( لَ = لە ) ( لِ = لی ) ( لُ = لو )

نموونە : لامی شەمسی ( ناخوێندرێتەوە ) :

وَالسَّمَاء ( وەسسەماء )

الرَّحْمٰن ( ئەررەحمان )

تێبینی : وەک لە نموونە شەمسییەکانی سەرەوە دیارە لامەکە ( ل ) هیچ هێمایەکی لەسەر نەنوسراوە ، واتە ناخوێندرێتەوە .

نموونە : لامی قەمەری ( دەخوێندرێتەوە ) :

الْعَابِدُون ( ئەلعابیدوون )

الْيَوْم ( ئەلیەوم )

تێبینی : وەک لە نموونە قەمەرییەکانی سەرەوەدا دیارە لامەکە ( لْ ) هێمای سکونی لەسەر نوسراوە ، واتە دەخوێندرێتەوە .

چەند تێبینییەکی زۆر گرنگ بۆ پیتی ( ل ) و وشەی پیرۆزی ( الله ) :

١ – هەر کات پیتی ( لام ) لەسەرەتای وشەدا هات حسابی شەمسی و قەمەری بکە ، بەڵام هەرکات دوو لام بە دوای یەکدا هاتن دانەیەکیان ساکین بوو و ئەوەی دووەم جوڵاو بوو ، ساکینەکە لاببە و جوڵاوەکە شەددەی پێ بدە ، وە ئەگەر لامێکی ساکین هات و ( ر ) یکی جوڵاوی بەدواوادا هات ، لامەکە لادە و شەددە بۆ پیتی ( ر ) زیاد بکە .

٢ – لەهەموو زمانی عەرەبیدا پیتی ( لام ) بە ناسکی دەخوێندرێتەوە ، واتە ( لامی کوردی ) جگە لە وشەی پیرۆزی ( الله ) کە ئەویش دوو حاڵەتی بۆ هەیە :

ئایە لامەکەی بە ( ڵ ) ی کوردی دەخوێندرێتەوە ، وەک ( الله ) ( ئەڵڵاهـ )

یان لامەکەی بە ( ل ) ی کوردی دەخوێندرێتەوە ، وەک ( لله ) ( لیللاهـ )

## چۆن ناوی پیرۆزی اللّٰه بخوێنمەوە ؟

جۆری یەکەم :

لە چوار حاڵەتدا ناوی پیرۆزی ( اللّٰه ) بە قەڵەوی دەخوێندرێتەوە ، واتە بە پیتی ( ڵ ) ی کوردی :

١ – ئەگەر لەسەرەتای خوێندنەوەدا بوو :

نموونە :

اللَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُو ( ئەڵڵاهو لا ئیلاهە ئیللا هو )

اللَّهُ الصَّمَدْ ( ئەڵڵاهوصصەمەد )

٢ – ئەگەر لەپێش ناوی پیرۆزی ( اللّٰه ) فەتحە هەبوو :

نموونە :

إِنَّ اللَّهَ ( ئیننەڵڵاهە )

قَالَ اللَّه ( قالەڵڵاهـ )

٣ – ئەگەر لەپێش ناوی پیرۆزی ( اللَّه ) زەممە هەبوو :

نموونە :

رَسُولُ اللَّه ( ڕەسولوڵڵاهـ )

يَدُ اللَّه ( یەدوڵڵاهـ )

٤ – ئەگەر لەپێش ناوی پیرۆزی ( اللَّه ) هەریەک لە پیتەکانی ( اْ ) و ( وْ ) هەبوو ، کە هێماکەی وەک ژمارە پێنجی کوردییە ، و لە ئایەتدا ناخوێندرێنەوە و هێماکەی نزیکە لە سکون و بەڵام سکون نین :

نموونە :

رَبُّنَاْ اللَّه ( ڕەببونەڵڵاهـ )

نَسُوْ اللَّه ( نەسوڵڵاهـ )

جۆری دووەم :

لە دوو حاڵەتدا ناوی پیرۆزی ( اللَّه ) بە ناسکی دەخوێندرێتەوە ، واتە بە پیتی ( ل ) ی کوردی :

١ – ئەگەر لەپێش ناوی پیرۆزی ( اللَّه ) کەسرە هەبوو :

نموونە :

بِسْمِ اللَّه ( بیسمی للاهـ )

سَبِيلِ اللَّه ( سەبیلی للاهـ )

٢ – ئەگەر لەپێش ناوی پیرۆزی ( اللَّه ) پیتی ( ي ) هەبوو :

نموونە :

يَهْدِي اللَّه ( یەهدی للاهـ )

يَأْتِي اللَّه ( یەئتی للاهـ )

# همزة الوصل

# هەمزەی گەیاندن

یەکەم : هەمزەی گەیاندن ئەو هەمزەیەیە کە لە سەرەتای هەندێک وشەدا دێت کە سکونیان هەیە ، هەربۆیەش هەمزە وەسڵەکە دێت تاکوو بتوانین سکونەکە بە ئاسانی بخوێنینەوە .

دووەم : هەمزەی وەسڵ کە ئەمە هێماکەیەتی ( ٱ ) لەبەشی سەرەوەی هەمزەکە نیشانەیەک هەیە کە لە پیتی ( ص ) دەچێت .

سێیەم : هەمزەی وەسڵ لەسەرەتا و دەسپێکدا دەخوێندرێتەوە .

چوارەم : هەمزەی وەسڵ لە بنەڕەتدا هیچ جوڵەیەکی نیە ، واتا هیچ کام لە ( کەسرە و فەتحە و زەممەی ) پێوە نیە .

بەڵام ئێمە لێرەدا چۆنیەتی خوێندنەوەکەی باسدەکەین ، واتا کام لە جوڵەکانی بۆدەبێت ، ئایە بیکەین بە ( فەتحە یان زەممە یان کەسرە ) کە ئەوانیش بەپێی شوێن و هاتنی جۆری وشە لەگەڵیدا دەگۆڕێت .

پێنجەم : هەمزەی وەسڵ لەزۆربەی حاڵەتەکانی قورئانی پیرۆز ناخوێندرێتەوە ، بەڵام ئەگەر بخوێندرێتەوە ، ئەوە دەیکەین بە سێ جۆر :

جۆری یەکەم : بە زەممە دەخوێندرێتەوە :

ئەگەر ئەو وشەیەی کە هەمزە وەسڵەکەی لەگەڵە سێیەم پیتی زەممە بوو ، ئەوا ئێمەش هەمزە وەسڵەکە بە زەممە دەخوێنینەوە .

نموونە :

ٱرْكُضْ ( ئورکوض )

ٱدْعُ ( ئودعو )

تێبینی : بۆ ژماردنی سێیەم پیت پێویستە هەمزە وەسڵەکەش هەژمار بکەیت ، واتا لە هەمزە وەسڵەکەوە دەست بە ژماردن بکە .

جۆری دووەم : لە چوار حاڵەتدا هەمزەی وەسڵ بە ( کەسرە ) دەخوێندرێتەوە :

یەکەم : ئەگەر ئەو وشەیەی هەمزە وەسڵەکەی لەگەڵە سێیەم پیتی فەتحە بوو .

نموونە :

ٱسۡتَغۡفِرۡ ( ئیستەغفیر )

دووەم : ئەگەر ئەو وشەیەی کە هەمزە وەسڵەکەی لەگەڵە سێیەم پیتی کەسرە بوو .

نموونە :

ٱصۡبِرۡ ( ئیصبیر )

سێیەم : ئەگەر هەمزە وەسڵەکە لەگەڵ وشەی ( اسم ) دا هات یان لەگەڵ ناودا هات ، ئەوە هەمیشە بە کەسرە دەخوێندرێتەوە .

نموونە :

ٱسۡمُهُۥٓ أَحۡمَدُۖ ( ئیسموهو ئەحمەد )

ٱمۡرَأَتُ ( ئیمرەئەت )

چوارەم : ئەگەر لەگەڵ وشەیەک هات سێیەم پیتی ( زەممە ) بوو ، بەڵام ( زەممە ) ـەکە ئەسڵی نەبوو ، واتا بنەڕەتی نەبوو ئەوا بە کەسرە دەیخوێنینەوە .

نموونە :

ٱبۡنُواْ ( ئیبنو )

تێبینی : دەتوانی بڵێی : ئەگەر ئەو پیتەی ( زەممە ) ی لەسەرە ، لەدوای خۆی ( و ) یکیش هات ، ئەوە هەمزە وەسڵەکە بە کەسرە بخوێنەوە .

جۆری سێیەمی خوێندنەوەی هەمزەی وەسڵ : بە ( فەتحە ) دەخوێندرێتەوە هەرکاتێک هەمزەی وەسڵ لەگەڵ لامێکی ناساندن ( تەعریفی ) هات ، واتا ئەگەر ( الــ ) بوو ، ئەوە ( ا ) ئەلیفەکە بە فەتحە دەخوێندرێتەوە .

نموونە :

ٱلشَّمۡسُ ( ئەششەمس )

ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ



تێبینی : ئەو هەمزە وەسڵە ناخوێندرێتەوە ، چوونکە باسمان کردووە لە زۆربەی حاڵەتەکان ناخوێندرێتەوە ، تەنها لەسەرەتا و دەستێک دەخوێندرێتەوە ، هەربۆیە ئەم هەمزەیەش لە حاڵەتی دەستپێکردنداین و ئێمەش لێرە لە حاڵەتی خوێندنەوە داین و نایخوێنینەوە .

# التقاء الساكينين بسبب التنوين

## بەیەک گەیشتنی دوو ساکین بەهۆی تەنوین

لەم بابەتەشدا ئێمە کار لەسەر هەمزەی گەیاندن ( الوصل ) دەکەین ، چۆن ؟

وەڵام : هەرکاتێک تەنوینەکان کە ئەمانەن : ( تەنوینی فەتحە ) ( تەنوینی کەسرە ) ( تەنوینی زەممە ) گەیشتن بە هەمزەی گەیاندن بەم شێوەیە :

ـٍ

ـً + ٱ = یاساکانی گەیشتنی دوو ساکین بەهۆی تەنوین

ـٌ

لەم کاتەدا ئێمە تەنوینەکان وەکخۆی دەردەبڕین و یائێک ( ی ) بۆ زیاد دەکەین لەکاتی خوێندنەوەدا .( بە کەسر کردنی تەنوینەکان )

نموونە : قَوۡمًا ٱللَّهُ ( قەومەنی لاهو )

تێبینی : خۆتدەزانی تەنوینی فەتحە ( بزوێنی کورت و نون ـە ) بەڵام بەڵام لەم یاسایەدا جگە لەو دووانە ( یائێکیش ) زیاد دەکەین ، وە بەهەمان شێوە بۆ تەنوینی ( کەسرە و زەممەش ) یائێکیان بۆ زیاد دەکەین لەکاتی خوێندنەوەدا .

نموونە : كَرَمَادٍ ٱشۡتَدَّتۡ ( کەرەمادینیشتەددەت )

تێبینی : ئاگاداربە ! هەمزەی وەسڵ لەم بابەتەدا ناخوێندرێتەوە چونکە لەم بابەتەدا هەرگیز هەمزەی وەسڵ لەسەرەتای ئایەت نیە

# الالفات السبع في القرآن الكريم

# حەوت ئەلیفەکە لە قورئانی پیرۆز

لەم بابەتەدا کار لەسەر ئەم ئەلیفە دەکەین کە ئەمە هێماکەیەتی ( أْ ) ئەلفێکە نیشانەیەکی هاوشێوەی ژمارە پێنجی کوردی لەسەرە .

ئەم جۆرە ئەلیفە تەنها لە کۆتاییدا دەخوێندرێتەوە ، واتە : یان لەکۆتایی ئایەتدا ، یاخود لەکاتی خوێندنەوەدا کاتێک لەسەری وەستاین ، لەکاتی سەرەتا و دەستپێک یان لە ناوەڕاستی ئایەت ناخوێندرێتەوە .

ئەم حەوت جۆرە ئەلیفەش لەم وشانەی خوارەوەدان :

تێبینی : لێرەدا تەنیا بە ئەندازەی یەک ( فەتحە ) نونی ( انا ) درێژ دەکرێتەوە .

یەکەم : ( أَنَاْ ) أَنَاْ أَكۡثَرُ مِنكَ مَالٗا وَأَعَزُّ نَفَرٗا ( ئەنە ئەکثەرو مینکە ئەموالەووەئەعەززو نەفەرا )

دووەم : ( لَّٰكِنَّاْ ) لَّٰكِنَّاْ هُوَ ٱللَّهُ رَبِّي وَلَآ أُشۡرِكُ بِرَبِّيٓ أَحَدٗا ( لاکیننە هولڵاهو ڕەببی وەلا ئوشریکو بیرەببی ئەحەدا )

سێیەم : (ٱلظُّنُونَاْ ) وَتَظُنُّونَ بِٱللَّهِ ٱلظُّنُونَاْ ( وەتەظوننەنە بیللاهیظونونا )

تێبینی : لێرەدا ئەم ئەلیفە دەخوێندرێتەوە چونکە وەک وتمان گەر بکەوێتە کۆتایی ئەوە دەخوێندرێتەوە ، بە ئەندازەی دوو جوولەش درێژ دەکرێتەوە .

چوارەم : ( ٱلرَّسُولَاْ ) وَأَطَعۡنَا ٱلرَّسُولَاْ ( وەئەطەعنەڕڕەسولا )

تێبینی : لێرەشدا ئەم ئەلیفە دەخوێندرێتەوە چونکە وەک وتمان گەر بکەوێتە کۆتایی ئەوە دەخوێندرێتەوە ، بە ئەندازەی دوو جوولەش درێژ دەکرێتەوە .

پێنجەم : ( ٱلسَّبِيلَاْ ) فَأَضَلُّونَا ٱلسَّبِيلَاْ ( فەئەضەللونەسسەبیلا )

تێبینی : لێرەشدا ئەم ئەلیفە دەخوێندرێتەوە چونکە وەک وتمان گەر بکەوێتە کۆتایی ئەوە دەخوێندرێتەوە ، بە ئەندازەی دوو جوولەش درێژ دەکرێتەوە .

شەشەم : ( قَوَارِيرَاْ ) كَانَتۡ قَوَارِيرَاْ ( کانەت قەواریرا )

تێبینی : لێرەشدا ئەم ئەلیفە دەخوێندرێتەوە چونکە وەک وتمان گەر بکەوێتە کۆتایی ئەوە دەخوێندرێتەوە ، بە ئەندازەی دوو جووڵـەش درێژ دەکرێتەوە .

حەوتەم : ( سَلَٰسِلَاْ ) إِنَّآ أَعۡتَدۡنَا لِلۡكَٰفِرِينَ سَلَٰسِلَاْ وَأَغۡلَٰلٗا وَسَعِيرًا ( ئیننا ئەعتەدنا لیلکافیرینە سەلاسیلە وەئەغلالەووەسەعیرا )

تێبینی : تەنها لە وشەی ( سَلَٰسِلَاْ ) دا دەتوانی ئەم ئەلیفە بخوێنیتەوە و دەشتوانی نەیخوێنیتەوە ، چۆن ؟

دەتوانین بڵێین : ( إِنَّآ أَعۡتَدۡنَا لِلۡكَٰفِرِينَ سَلَٰسِلَاْ )( ئیننا ئەعتەدنا لیلکافیرینە سەلاسیلا )

وە دەتوانین بڵێین : ( إِنَّآ أَعۡتَدۡنَا لِلۡكَٰفِرِينَ سَلَٰسِلَ ) ( ئیننا ئەعتەدنا لیلکافیرینە سەلاسیل )

# الحروف قلقلة

# پیتەکانی قەلقەلە

قەلقەلە بریتییە لە لەرینەوە واتە بەرزکردنەوە و قەڵەوکردنی ئەم پێنج پیتانە لەکاتی خوێندنەوە :

( ق ، ط ، ب ، ج ، د ) کە کۆکراونەتەوە لە وشەی ( قطب جد )

لەم بابەتەدا مەرجە ئەم پێنج پیتەی سەرەوە ساکین بن ، وە ئەگەر ساکین بوون ئەوە بە جوانتر و قەڵەوتر لە پیتەکانی پێش خۆی و دواى خۆی دەخوێنینەوە .

تێبینی : لەکاتی خوێندنەوەی ئەم پێنج پیتە دەبێ قەڵەو بکرێت لەکاتی خوێندنەوەیاندا ، بەڵام نابێ بکرێن بە شەددە ، وریابە !

قەلقەلە دابەش دەکرێت بۆ سێ جۆر :

جۆری یەکەم : قەلقەلەی بچووک ( قلقلة صغرى ) :

ئەم جۆرە کاتێکە کە یەکێک لە پێنج پیتەکانی قەلقەلە کە پیتەکانی (قطب جد ) ــە لە ناوەڕاستی وشەدابوو ، بەڵام هەر مەرجە ساکین بن ، ئەوکاتە پیتەکە کەمێک قەڵەو دەکەین ودەیلەرێنینەوە ، بەڵام بە بچووکی .

نموونە : خَلَقْنَا ( خەلەقنا )

يَدْخُلَ ( یەدخول )

تێبینی : لەم جۆرەدا لەکاتی قەلقەلەدا نابێ دەنگت بپچڕێنی دوای لەرینەوە و قەڵەوکردن ، بەڵکوو ڕاستەوخۆ دەچیتە سەر پیتی دوای خۆی .

واتا نابێت بڵێی : يَدْخُلَ ( یەد……خول )

بەڵکو دەبێ بڵێی : يَدْخُلَ ( یەدخول )

جۆری دووەم : قەلقەلەی ناوەند ( قلقلة وصطى ) :

ئەم جۆرەیان کاتێکە کە یەکێک لە پیتەکانی قەلقەلە ( قطب جد ) دەکەونە کۆتایی ئایەت یان خۆمان لەسەری دەوەستین و دەبێت بە سکوون .

تێبینی : لەکاتی خوێندنەوەی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز مەرج نیە تەنها لەکۆتایی ئایەت بوەستی ، دەتوانی لە ناوەڕاستی ئایەتیش بوەستی بەو مەرجەی واتای ئایەتەکە تێک نەدات ، لەو ساتەدا لەکاتی وەستانەکە کۆتا پیت ڕاستەوخۆ دەبێت بە سکون و حەرەکەکەی سەری ناخوێندرێتەوە ، ئینجا هەر حەرەکەیەک بێت .

نموونە : وَمَن يُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ يَهْدِ قَلْبَهُۥ ( وەمەییوئمین بیللاهی یەهدی قەلبەهـ )

لێرەدا ئەمە کۆتایی ئایەت نیە تاکوو لەسەری وەستابم ، بەڵکو ناوەڕاستی ئایەتی ( ١١ ) سورەتی ( التغابن ) و ماندووبوم لە خوێندنەوە و لەسەری وەستاوم ، بۆیەش ناڵێم ( یەهدی قەلبەهو ) بەڵکو مادام لەسەری وەستاوم دەڵێم ( یەهدی قەلبەهـ )

هەربۆیە ئەگەر پیتەکانی ( قطب جد ) ی قەلقەلە لەسەری وەستاین دەبن بە سکون و دەیانکەین بە قەلقەلە ، ئینجا ئەگەر لە بنەڕەتیشدا سکون نەبن، بەهۆی ئەم تێبینیەی سەرەوە .

تێبینی : لە جۆری دووەمی قەلقەدا پیتەکە قەڵەو دەکەین و دەیلەرێنینەوە بەشێوەیەکی مامناوەند ، واتە کەمێک لە جۆری یەکەمی قەلقەلەی یەکەم قەڵەوتر دەیخوێنینەوە .

نموونە :

الْفَلَقِ ( ئەلفەلەق )

الْبَابَ ( ئەلباب )

## جۆری سێیەم : قەلقەلەی گەورە ( قلقلة كبرى )

ئەمجۆرەیان کاتێکە کە پێنج پیتەکەی قەلقەلە ( قطب جد ) لەکۆتایی هاتن ، بەڵام شەددەیان لەسەر بوو ، ئەمجۆرەیان لەکاتی خوێندنەوەدا قەڵەوتر دەخوێندرێتەوە لە دوو جۆرەکەی تر ، چوونکە جگە لەوەی لە کۆتاییە ، شەددەشی هەیە و بۆیە توندتری دەکەین .

نموونە :

الْحَجَّ ( ئەلحەجج )

الْحَقَّ ( ئەلحەقق )

أَشَدُّ ( ئەشەدد )

# الاحكام ( الراء )

## یاساکانی پیتی ( ر )

لەم بابەتەدا باس لە چۆنیەتی خوێندنەوەی پیتی ( ر ) دەکەین لە قورئانی پیرۆزدا کە ئایە پیتەکە بە سوکی دەخوێندرێتەوە واتە بە ( ر ) دەخوێندرێتەوە یاخود بە ( ڕ ) دەخوێندرێتەوە ؟
مامۆستایانی تەجوید چەند یاسایەکیان داناوە بۆئەوەی کە لەکوێ ( پیتی ر ) بە سوکی و لەکوێ بە قەڵەوی دەخوێندرێتەوە

بەڵام بۆ ئاسانتر تۆ دەتوانی یاساکانی پیتی ( ر ) ی سوک لەبەر بکەیت و ئەوەی دەمێنێتەوە بۆخۆت لە ( ر ) ی قەڵەو هەژماری بکە و لەکوێ گەشتیت بە پیتی ( ر ) ئەگەر لە یاساکانی ( ر ) ی سوک نەبوو ئەوە بزانە یاساکانی ( ر ) ی قەڵەوە و بۆخۆت بە قەڵەو بیخوێنەوە .

یاساکانی پیتی ( ر ) ئەگەر بە سوکی بخوێندرێتەوە چوار جۆرە :

یەکەم : ئەگەر پیتی ( ر ) کەسرەی لە ژێر بوو : ( رِجَالٌ ) ( ریجال )

دووەم : ئەگەر پیتی ( ر ) ساکین بێت و پێشی کەسرە بێت : (فِرْعَوْنَ ) ( فیرعەون )

سێیەم : ئەگەر پیتی ( ر ) ساکین بوو و پێش ئەویش ساکین بوو و دووەم پیت پێش ( ر ) کەسرە بوو : (حِجْرٍ ) ( حیجر )

تێبینی بۆ خاڵی سێیەم : ئەگەر پێش پیتی ( ر ) ی ساکین پیتێکی ساکین هاتبوو ئەوە سەیری پیتێکی پێش ئەویش بکە ئەگەر ئەو کەسرە بوو ، ئەوە بە سوکی بیخوێنەوە ، واتە :

پیتی کەسرە + پیتی ساکین + پیتی ( ر ) ی ساکین = پیتی ( ر ) بە سوکی بخوێنەوە .

چوارەم : ئەگەر ( ر ) ساکین بێت و پێش خۆی پیتی ( ي ) هاتبێت : ( بَشِيرٌ ) ( بەشیر )

تێبینی : بابەتێکی ترمان هەیە لە یاساکانی ( ر ) کە پێی دەگوترێت ( جواز الوجهين ) واتە ئاساییە کە بە قەڵەو یان بە سوکی بیخوێنییەوە ، بەڵام تۆ بۆ ئەوەی بابەتەکە لەسەرت قورس نەبێت هەر یاساکانی ( ر ) ی سوک بزانە و لەکوێ گەشتیت پێیان ئەوە بە سوکی بیخوێنەوە و ئەوەی ماوەتەوە بە قەڵەوی بیخوێنەوە

# المد

## درێژکردنەوە

بریتییە لە درێژکردنەوەی سێ پیت لەکاتی خوێندنەوەدا ، ئەوانیش ( ا ، و ، ي ) .

مەد هێما دەکرێت لە قورئانی پیرۆزدا بە ( ˜ ) لەسەر هەریەکە لە پیتەکانی ( ا ، و ، ي ) هەیە ، ئەمەش ئاماژەیە بۆ درێژ کردنەوە .

پیتەکانی مەد لە چ کاتێکدا دەبن بە پیتی مەد درێژ کرنەوە ؟

وەڵام : ئەگەر ساکین بن ، واتە مەرجە ساکین بن .

تێبینی : بۆ ناسینەوەی پیتەکە لە قورئانی پیرۆزدا هیچی لەسەر نەنوسراوە ، واتە : ( ا ، و ، ي ) هیچی لەسەر نیە و وەکخۆیان هاتوون .

درێژکردنەوە چۆنە ؟

وەڵام : درێژکردنەوە بریتییە لە چەند جوڵەیەک واتە ئەوپیتە چەند جارێک درێژ دەکەینەوە ، بەشێوەیەکی گشتی باسی درێژکردنەوەمان کردووە لە ( سەرەتای ئەم نامیلکەیە ) ، کە گوتمان بۆ درێژکرنەوە پشت بە ژماردن دەبەستین بۆ زانینی ژمارەی درێژکردنەوە .

بۆنموونە : بۆ زانینی ئەوەی کە دوو جوڵە چەندە ، لەدڵی خۆماندا لەکاتی خوێندنەوەدا دەیژمێرین لە ( ١ بۆ ٢ )

واتە : چەند کاتمان پێدەچێت بۆ گەیشتن لە ژمارە (١ ) بۆ ژمارە ( ٢ ) ئێمەش ئەوەندە درێژی دەکەینەوە .

بەهەمان شێوە بۆ ( چوار جوڵە ) و ( شەش جوڵە )

بەشێوەیەکی گشتی دوو هۆکار مەد درووست دەکەن ، ئەوانیش :

( هەمزە ) و ( سکون ) واتە ئەگەر یەکێک لەو دوو هۆکارە لەگەڵیان هات .

مەد بۆ دوو جۆری سەرەکی دابەش دەبێت :

١ – مد الاصلي

٢ – مد الفرعي

ئەم دوو جۆرەش بۆ چەند لقێکی بچووک دابەش دەبن

جۆری یەکەم : مد الاصلي : ئەم جۆرە بۆ چوار لق دابەش دەبێت ، کە هەرچوار لقەکە ، دوو جوڵە درێژ دەکرێتەوە .

جۆری یەکەم لە مد الاصلي : المد الطبيعي : کاتێک ڕوودەدات کە پیتەکانی مەد هاتن و لەپێش ( ا ) فەتحەی لەپێش بێت ، یان ( و ) هەبێت و زەممەی لەپێش بێت ، یان ( ي ) هەبێت و کەسرەی لە پێش بێت ، ئەوساتە دوو جوڵە درێژ دەکرێنەوە.

یاسا :

ـَ + ا = مد الطيعي

ـِ + ي = مد الطبيعي

ـُ + و = مد الطبيعي

نموونە : قَالَ ( قـــالە ) قِيلَ ( قيـــلە )

تێبینی : بۆ زیاتر تێگەیشتن لە بابەتەکە ، سەیربکە : ئەلیف خۆی بزوێنە و مادام بزوێنیشی لەپێش بێت کە فەتحەیە ، کەواتە دوو بزوێن بەیەکتر گەیشتوون و تۆش دوو جووڵە درێژی بکەرەوە .بەهەمان شێوەش بۆ زەممە و کەسرە .

جۆری دووەم : مد العوض : ئەو مەدە کاتێک درووست دەبێت کە وشەیەک بە تەنوینی فەتحە کۆتایی هاتبێت ، جا وشەکە بۆخۆی لە کۆتایی ئایەت بوو ، یان لە ناوەڕاستی ئایەت بوو ، بەڵام تۆ لەسەری وەستایت ، ئەوکاتە ئێمە دوو جووڵە درێژی دەکەینەوە .

نموونە : حَكِيماً ( حەکیما )

ئەگەر لەسەر ئەم وشەیە بوەستم ناڵێم : ( حەکیمەن ) ، بەڵکو دەڵێم : ( حەکیما )

تێبینی : بۆ ئەم جۆرە تاکوو لێت قورس نەبێت کاتێک تەنوینی فەتحە کەوتە کۆتایی یان کۆتایی ئەو وشەیەی کە تۆ لەسەری وەستاویت لەکاتی خوێندنەوەدا ، ئەوە دوو جوڵە درێژی بکەرەوە .

نموونە : رَحِيماً ( رەحیما )      بِنَاءً ( بینائا )

جۆری سێیەم : مد صلة صغرى : ئەو مەدەیە کە ( هاء ) ی ڕاناو (ئەو هائەی کە بە شێوەی بزوێنی کورتی کوردی دەنوسرێت بۆ نموونە ( فیە ) ، هەرکاتێک ئەم هائە هات و لەپێش و دوای ئەم هائە پیتێکی جوڵاو ( حەرەکە لەسەر ) هات ، ئەوە دوو جوڵە درێژی بکەرەوە .

یاسا :

پیتی متحرك + ه + پیتی متحرك = مد صلة صغرى

نموونە : بِهِ جَمْعاً ( بیهی جەمعا )      لَهُ مُلْكُ ( لەهو مولک )

( لێرەدا ئاگەداربە هائەکە بۆخۆی درێژناکرێتەوە بەڵکو جوڵەکەی کە ( کەسرە ) یان ( زەممە ) یە ، ئەوان دوو جوڵە درێژ دەکرێنەوە . )

چەند تێبینییەکی گرنگ :

یەکەم بۆ ناسینەوەی مد صلة صغری لە قورئانی پیرۆزدا ( و ) یان ( ي ) یٚکی بچووک لەدوای هائەکە کراوە .

دووەم : ئەگەر پێش هائەکە ساکین بوو ئەوا هائەکە وەکخۆی دەخوێندرێتەوە ، واتە دوو جوڵە درێژی ناکەینەوە .

سێیەم : تەنیا دوو وشەمان هەیە کە لە یاساکان لادەدەن :

١ - يَرْضَهُ لَكُمْ ( یەرضەهو لەکوم ) ( ڕاستە هائەکە پێش و دواوەی پیتی جوڵاوە ، بەڵام درێژی ناکەینەوە )

٢ – فِيهِ مُهَاناً ( فیهی موهانا ) ( لێرەشدا هائەکە پێشی جوڵاو نیە ، بەڵام دوو جوڵە درێژی دەکەینەوە )

جۆری چوارەم : مد البدل : ئەمجۆرەیان ( هەمزەی لەگەڵە ) واتە لەپێش پیتەکانی مەد ( ا ، و ، ي ) هەمزە دێت ، بەڵام مەرجە ئەو هەمزەیەی کە لەپێش ( ئەلیفەکە ) دێت فەتحەی لەسەربێت ، وە ئەو هەمزەیەی لەپێش (واوەکە ) دێت زەممەی لەسەربێت ، وە ئەو هەمزەی لەپێش ( ي ) دێت کەسرەی لەژێر بێت ، ئەو ساتە دوو جوڵە درێژی دەکەینەوە .

یاسا :

ءَ + ا = مد البدل

ءُ + و = مد البدل

ءِ + ي = مد البدل

تێبینی : ئەم بابەتە وەک ( مد الطبیعی ) وایە ، تەنها جیاوازی ئەوەیە کە لەم بابەتە هەمزەی لەگەڵە .

نموونە :

ءَادَمَ ( ئادەم ) ( دوو جوڵە ئەلیفەکە درێژ دەکرێتەوە )

أُوتُوا ( ئوتو ) ( دوو جوڵە واوەکە درێژدەکرێتەوە )

جۆری دووەمی مەد : مد الفرعي : ئەم جۆرەی مەد زیاتر بەربڵاوترە و زۆرترە ، ئەم جۆرەش دابەشدەکرێت بۆ دوو جۆری سەرەکی:

جۆری یەکەم : ئەوانەی بەهۆی هەمزە درووستدەبن ، کە سێ دانەن .

جۆری دووەم : ئەوانەی بەهۆی سکون درووستدەبن کە شەش دانەن .

تێبینی : لە مد الفرعي دا بەشێوەیەکی گشتی ( چوار یان پێنج یان شەش ) جوڵە درێژدەکرێنەوە .

جۆری یەکەم : ئەوانەی بەهۆی هەمزەوە درووستدەبن :

١ – مد الواجب المتصل : ئەم جۆرەیان کاتێک ڕوودەدات کە پیتەکانی مەد لەدوای خۆیان ( هەمزە ) هات بەڵام لە هەمان وشەدا نەوەک وشەیەکی جیاواز ، ئەوکاتە پیتەکانی مەد ( چوار یان پێنج ) جووڵە درێژدرکەینەوە ، بەڵام ( چوار جوڵە ) باشترە .

یاسا :

ا

و + ء = چوار یان پێنج جوڵە درێژکردنەوە .

ي

تێبینی : بۆ ناسینەوەی ئەم بابەتە ، ئەگەر لە قورئاندا ئەم هێمایەت بینی ( ـــٓ ) لەسەر ( ا ) یان ( و ) یان ( ي ) کە وەک هێڵێکی شەپۆلدار وایە ، و لە دوای خۆی هەمزە هاتبوو ، ئەوە ڕاستەوخۆ ( چوار ) یان ( پێنج ) جووڵە درێژی بکەرەوە .

نموونە :

جَآءَ ( جااائە )

الفَآئِزُون ( ئەلفاااائزون )

سُوٓءَ ( سووووء )

٢ – مد الجائز المنفصل : کاتێک ئەم جۆرە ڕوودەدات کە پیتەکانی مەد هاتن و لەدوای خۆیان هەمزە هات ، بەڵام لەیەک وشە نەبوون ، بەڵکوو پیتەکانی مەد لە کۆتایی وشەی یەکەم بوون و هەمزەش لە سەرەتای وشەی دووەم بوو ، ئەو کاتەش چوار یان پێنج جووڵە درێژی دەکەینەوە ، لە حاڵەتی ناچاریشدا دەتوانین دوو جوڵە درێژی بکەینەوە .

تێبینی : بۆ ناسینەوەی ئەم بابەتە ، ئەگەر لە قورئاندا ئەم هێمایەت بینی ( ــٓ ) لەسەر ( ا ) یان ( و ) یان ( ي ) کە وەک هێڵێکی شەپۆلدار وایە ، و لە دوای خۆی هەمزە هاتبوو ، ئەوە ڕاستەوخۆ ( چوار ) یان ( پێنج ) جووڵە درێژی بکەرەوە .

نموونە :

بِمآ أَوْحَيْنَا ( بیماااا ئەوحەینا )

فِيٓ أَنْفُسِكُم ( فیییی ئەنفوسیکوم )

تێبینی بۆ هەردوو جۆرەکەی سەرەوە لە مەد : بۆ ناسینەوەی ئەم دوو جۆرە ئەگەر لە قورئاندا ئەم هێمایەت بینی ( ــٓ ) لەسەر ( ا ) یان ( و ) یان ( ي ) کە وەک هێڵێکی شەپۆلدار وایە ، و لە دوای خۆی هەمزە هاتبوو ، ئەوە ڕاستەوخۆ ( چوار ) یان ( پێنج ) جووڵە درێژی بکەرەوە ، جا لە یەک وشەدا بوون یان نا .

٣ – مد الصلة الکبری : پێشتر لە ( مد الصلة صغری ) باسمان کرد کە ئەو هائەی وەک بزوێنی کورتی کوردی وایە ، دوو جوڵە درێژی دەکەینەوە ، بەڵام لەم بابەتەدا هەر هەمان ( هاء ) چوار یان پێنج جوڵە درێژی دەکەینەوە .

ئەم جۆرە کاتێک ڕوودەدات کە ( هائەکە ) پێش خۆی پیتێکی جوڵاو بێت و لە دوای خۆی ( هەمزە ) یەکی جوڵاو بێت :

یاسا :

پیتێکی جوڵاو + هاء + ء ( جوڵاو )

ئەوکاتە ( چوار ) یان ( پێنج ) جوڵە درێژی دەکەینەوە .

نموونە :

مَالَهُ, أَخْلَدَ ( مالەهووووو ئەخلەدە )

تێبینی : ئاگەداربە لەم بابەتەدا ( هاء ) درێژ ناکرێتەوە ، بەڵکوو ( و ) یان ( ي ) درێژ دەکرێتەوە ، ئەگەر سەرنجی نموونەکەی سەرەوە بدەی دەبینی لەسەر ( هائەکە ) زەممە هەیە و ئێمەش زەممەکە درێژ دەکەینەوە ، بەهەمان شێوەش ئەگەر کەسرە هەبوو ئێمە کەسرە درێژ دەکەینەوە .

تێبینی : لە قورئاندا بۆ ناسینەوەی ئەم بابەتە ( و ) یکی بچووک لەنێوان هەمزە و هائەکە دەکرێت و ( ـــٓ ) ئەم هێمایەشی لەسەر دەکرێت بە بچووکی ، ئەگەر ئەمەت بینی ، ئەوە چوار یان پێنج جووڵە درێژی بکەوە .

هۆکاری دووەمی درووستبوونی مەد : سکوونە

١ – مد اللازم الكلامي : ئەمەش دابەش دەکرێت بۆ دوو لق ، ئەوانیش :

یەکەم : مەدی لازمی وشەی قورس : ئەو مەدەیە کە پیتەکانی ( ا ، و ، ي ) بەدوای خۆیاندا پیتێکی شەددە دار بێت هەر لە هەمان وشەدا ، ئەمەش بە ئەندازەی شەش جوڵە درێژ دەکەینەوە .

نموونە : الضَّآلِّين ( ئەضضاااااااللين )

الصَّآخَّة ( ئەصصااااااخخەهـ )

تێبینی : بۆ ناسینەوەی بابەتەکە ئەگەر ( ا ) بینی و پێشی فەتحە بوو ، یان ( و ) بینی و پێشی ( زەممە ) بوو ، یان ( ي ) بینی و پێشی ( کەسرە ) بوو ، و لە دوای خۆیان شەددە هەبوو ، ئەوە شەش جوڵە مەددەکە درێژ بکەرەوە .

٢ – مەدی لازمی وشەی بچوک : ئەوەیە کە لەدوای پیتەکانی مەد ( ا ، و ، ي ) سکونێکی هەمیشەیی هاتبێت ئەوە ئەویش شەش جوولە درێژی دەکەینەوە .

نموونە : ءَآلْآنَ ( ئاااااالئاان )

ئەم جۆرەی مەد تەنها لەم وشەیەدا هەیە و لەبەری بکەو بیناسەوە ، دوو جار هاتووە لە قورئاندا ، هەردوو جارەکەش لە سورەتی یونس دا هاتووە .

مەدی لازمی پیتی : لەم جۆرە مەددەدا باس لە چەند پیتێک دەکەین کە لە سەرەتای چەند سورەتێکدا هاتوون ، لازمی پیتی لەو پیتانە پێک دێت کە لە خوێندنەوەدا بە سێ پیت دەخوێندرێتەوە ، وەک پیتی لام ( ل ) کە ئاساییی بە لام دەخوێندرێتەوە کە لە سێ پیت پێکهاتووە ( ل ا م ) ، وە هەروەها ئەم پیتانەی لەم یاسایەدا کاریان پێدەکەین :

١ – دەبێ لە خوێندنەوەدا بە سێ پیت بخوێندرێتەوە

٢ – پێویستە ناوەڕاستی پیتەکان یەکێک بێت لە پیتەکانی مەد

مەبەست لێرەدا ئەوەیە کە : کاتێک دەڵێم ؛ لام ، ناوەڕاستی ( لام ) ئەلیفە و ئەلیفیش پیتی مەددە

ئەو پیتانەشی لە قورئاندا بە سێ پیتی دەخوێندرێتەوە ناوەڕاستەکانیان یەکێکە لە پیتەکانی مەد.

تێبینی : بۆ ناسینەوەی ئەو پیتانەی کە لە خوێندنەوەدا بە سێ پیت دەخوێندرێنەوە :

هەشت پیتن کە کۆ کراونەتەوە لە وشەی ( نقص عسلكم ) هەریەک لەم هەشت پیتانە لە سەرەتای چەند سورەتێک دێن ، بەجۆرێک لە هەندێکیان یەک پیت هاتووە و لە هەندێکی سێ و لە هەندێکی زیاتر لە سێ .

پیتەکان : ( ن = نون ) ( ق = قاف ) ( ص = صاد ) ( ع = عەین ) ( س = سین ) ( ل = لام ) ( ک = کاف ) ( م = میم )

ئەگەر سەرنج بدەیت لە ناوەڕاستی هەریەکەیاندا پیتی مەد هاتووە ( ا ، ي ، و )

مەدی لازمی پیتی بەشێوەیەکی گشتی دابەش دەبێت بۆ دوو لقی سەرەکی :

لقی یەکەم : مەدی لازمی پیتی قورس : ئەمجۆرەیان لەم پیتانە پێکدێت کە لە خوێندنەوەدا بە سێ پیت دەخوێندرێنەوە و ناوەڕاستەکانیان پیتی مەدە ، ئەگەر پیتەکە گەیشت بە سکون وە سکونەکەش لەگەڵ دوای خۆی تێکهەڵکێش کرا ئەوا دەبێتە مەدی لازمی پیتی قورس .

ڕونکردنەوەی بابەت : بۆنموونە لەسەرەتای سورەتی ( البقرة ) کاتێك بە ( الم ) دەستپێدەکات بۆ خوێندنەوەی :

الٓمٓ ( ئەلیف لاااااام میییییم ) ( ئەگەر سەرنج بدەیت ئەلیف و لام شەش جوڵە درێژ دەکرێتەوە )

وە ئەگەر سەیر بکەیت کاتێک لامەکە شەش جوڵە درێژ دەکەیتەوە کە لە کۆتاییەکەیدا ( م ) ێک هەیە و کاتێکیش پیتی ( م ) دەستپێدەکات دووبارە پیتی ( م ) هەیە ، ئێمەش دەزانین کە ئەم دوو پیتە تێکهەڵکێش دەکرێن چونکە یەک جۆر پیتن و هەردووکیشیان سکونن ( م + م = مّ )

بۆیە لەم بابەتەدا هەرکاتێک ئەو پیتانەی بەدوای یەکتری دێن تێکهەڵکێش کران ئەوە دەبن بە مەدی لازمی پیتی قورس

کەواتە نموونەکەی سەرەوە دەبێت بە :

( ئەلیف لاااااممیییییم )

تێبینی : ئەگەر تێبینی بکەیت دەبینی لەسەر ئەو پیتانەی درێژدەکرێنەوە هێمای ( ــًـ ) هەیە کەواتە ئەو پیتەی ئەمەی لەسەرە بزانە پیتی ناوەڕاستی ( شەش ) جووڵە درێژ دەکرێتەوە .

تێبینی : ئاگەداربە ! ئەم جۆرە ( قورس ) تەنها لە کاتی تێکهەڵکێشاندا ڕوودەدات ، واتە ( م+م )

لقی دووەم : مەدی لازمی پیتی سوک : ئەمجۆرەیان لەو پیتانە پێکدێت کە لە خوێندنەوەدا بە سێ پیت دەخوێندرێنەوە و ناوەڕاستەکانیان پیتی مەدە ، وە گەیشتووە بە سکونێک و سکونەکەش لەگەڵ دوای خۆی تێکهەڵکێش ناکرێت ، ئەو ساتە دەبێتە مەدی لازمی سوک ، و شەش جولە درێژ دەکرێتەوە .

ڕونکردنەوەی بابەت :

بۆنموونە : لەسەرەتای سورەتی یوسف دا کاتێک بە ( الر ) دەستپێدەکات ، بەم شێوەیە دەخوێندرێتەوە :

آلّر ( ئەلیف لاااااام ڕاء ) ئەگەر سەرنج بدەیت تەنها ( ئەلیفەکە ) درێژدەکەینەوە ، بە ئەندازەی شەش جووڵە ، وە ئەگەر سەنجی ئەوەش بدەیت کە کۆتایی لام بە ( م ) هاتووە و سەرەتای راء بە ( ر ) هاتووە بۆیە تێکهەڵکێش ناکرێن .

کەواتە دەبێت بە مەدی لازمی سوک ( م + ر = ڕونادات )

تێبینی : ئەگەر ببینی تەنها لەسەر ئەو پیتەی کە درێژ دەکرێتەوە هێمای ( ـــ ) کراوە ، بۆیە تۆش تەنیا ئەو پیتەیان درێژ بکەرەوە.

تێبینی : ئاگەداربە ئەم جۆرەی مەد تەنها لەکاتی نەبونی تێکهەڵکێشان ڕوئەدات .

چەند تێبینییەکی گرنگ دەربارەی مەد بە شێوەیەکی گشتی :

١ – ئەلیف هەر بە ئەلیف دەخوێندرێتەوە و درێژکردنەوەی تێدانیە .

٢ - پێنج پیت هەن کە تەنها دوو جوڵە درێژ دەکرێنەوە ، کە کۆکراونەتەوە لە وشەی ( حي طهر )

٣ – هەردوو وشەی :

ءَآلذَّكَرَيْنِ ( ئاااااذەكەرەين )

ءَآللَّهُ ( ئاااااڵڵاھـ )

وەکوو مەدی لازمی قورسن بەڵام ناوەکەیان جیایە و ناویان ( مد الفرق ) ـە بەهەمان شێوە شەش جووڵە درێژ دەکرێنەوە و دوو جوڵەش دروستە .

٤ – هەرکاتێک ئەم هێمایەت بینی لەسەر پیتێک ( ــٓـ ) ئەوا تۆ چوار جوڵە پیتەکە درێژ بکەرەوە ، بەڵام ئەگەر لە دوای ئەم هێمایە شەددەشت بینی ئەوە شەش جوولە درێژی بکەرەوە .

تَمَّتْ بِحَمْدِاللَّه

